# پێنج ئەنگوست دەبنە یەک مست




شیعر: مامۆستا هەژار
نەخش ونیگار: بهزاد تارا

## به ناوی خوا

ئەم نامیلکە پەخشانێکی ـ بەرەسەن ـ رووسیە؛ نووسراوەی بریژیت ونگوربورسکی؛ کە بە چەن زمانان وەرگەڕاوەتەوە. ساڵی ۶۲ی هەتاوی (۸۳ ـ ز)، «کانون پرورش فکری کودکان و نوجوانان» بەرگێک لەو کتێبەی پێدام ـ کە لە ئاڵمانی وەرگەڕابوە سەر فارسی و چاپ کرابوو ـ بیکەمە کوردی و چاپی کەن. وەرگێڕاوە زۆر خاوو خلیسک و بێ‌تام، نەخشەکانیشی نەپۆڕو ناشیرین بوون؛ بەڵام بەو حاڵەش شوێنی هەستی ناسکی نووسەرەکەی ـ وەکوو ئاوێ پووش و پەڵاش داپوشیبێ ـ جارجارە خۆی بە رچاو دەخست و دەردەکەوت کە چۆناوچۆن توانیویە وەستایانە، بناغەی ئەو چیرۆکە کورتە داڕێژێ و لە ئاکامدا قسەیەکی خۆش، بکاتە ئامۆژگاریەکی پوخت و پاراو.

هەرچەندی حەولم دا، نە ئەسڵی نووسراوە و نەک هیچ وە رگێڕاوێکی ـ بە هیچ زمانێ ـ دە ستم نەکەوت. فارسیەکەش ئەوە حاڵیەتی. دیارە بەم جۆرە بۆ منێک کە تازە گارەگارە کوردیم دە خوێندو لارە لارەیەک دەمنووسی، کاری وا مەیسەر نەدە بوو.

بردمە خزمەتی بلیمەتی وەرگێڕان، خواڵێ خۆش‌بوو «مامۆستا هەژار» و لە سەر تا خوار نووکو بە دی کارەکەم بۆ گێڕایەوە. مامۆستا سووکە چاوێکی پێیدا خشاند؛ کەیفی گرتی. وەک بڵەی ئەم پێنج ئەنگوستە، ئەو پێنج زاراوەی زمانی کوردی وە بیر هێنابووە ـ کە هیچیان ئەوانی دیکە بە هیچ ناگرن! ـ فەرمووی: زۆر باشە کارێکی لەگەڵ دەکەم. چەن رۆژ لەودوا بانگی کردم؛ کە خوێندیەوە، وەک مردوێکی زیندوو کردبێتەوە، وابوو. زۆر ئافەرینم لە خۆم کرد! جا تو خوا حەیف نەبوو ئەو ئەستێرە جوانە، لە ئاسمانی زمان و فەرهەنگی کوردیدا ـ بۆ منداڵ و تازە لاومان ـ وەدی نەیێت و نەبێت و خۆ نەنوێنێ و نەدرۆشێ و چاو هەڵنەیێنێ؟

وەک رۆڵەیێکی خۆشەویست، لە دەستی مامۆستام سەندو پۆشتەم کردو دام بە «کانون»؛ بەو مەرجە بیدەن نەخش و نیگارێکی جوان و لەباری هێژای ئەو کارەی بۆسازکەن. «بەڵێ بە چاوان»یان گوت و لیێان ساندم. ئیتر خەبەرێکی نەبوو، تا بیستم لە چاپ دەرچووە. چاوم پێ کەوت، سرێ کردم. بە بێ ئەوەی خۆ ماندوو کەن، هەر بەو وێنە بێ فەرانەی فارسیەکەی و بە چەن هەڵە و پەڵەیکەوە، چاپیان کربوو.

ئێستا کە هەژدەساڵ لە و ماوە رادە برێ و چەن ساڵە لە سنە دە ژیم، لەم شارە ـ لە خوا بە زیاد بێ ـ زۆر هونەر مەندی بە رزو بەهەستم دیۆن، کە هەرکام لە کاری خۆدا، ئە توانم بێژم هەڵکەوتەن. یەک لەوانە، لاوی دە س نەخشین و زیرەک، کاکە «بهزاد تارا»یە؛ کە هەر ناسیم و چەن کارێکیم چاوپێ کەوت، کەوتمەوە بیری «پێنج ئەنگوست». لە ولاشەوە بە ناوبژی برای کوردم کاک «علیرضا اشرافی» ـ کە ئێستا بەرپرسی «کانون» لە پارێزگای کوردستانە ـ سەبارەت بەم نامیلکە پێک هاتین کە کەسمان لە کەس بێ و من لە رابردوو وازبێنم و ئەوانیش کارێکیان بە داهاتوو نەبێ. بەم جۆرە «پێنج ئەنگوست» جارێکی تر بە وێنەیەکی تر، رووناکی دە بینێتەوە؛ کە هیوادارم منداڵانی خوێن شیرین و لاوانی خۆشەویستمان پەسندی کەن.

**ماجد مردوخ روحانی**

هاوینی ۱۳۸۰(۲۰۰۱ـز)



وەک ئەیزانین ، هە موو دەسیٚ پیٚنج قامکی هەس :
تووتە، براتووتە ،زەڕنەقووتە، قامکی شادە ، قامگە گەورە .

**هەموو**: گشت؛ **قامک**: ئەنگووس، ئەنگوست، تبل، تلی؛ **زەڕنەقووتە**: بالاٚ بەرزە.



هەبوو نەبوو ، دوودەست هەبوو :  یەکێ شین بوو ، یەکێ سوور .
قامکەکانی پەنجەی شین ، دایم و دەرهەم لێک دوور بوون ؛ خۆپەسندو ناجوور بوون .

**شین**: سەوز؛ **دایم و دەرهەم**: هەمووکاتێ ، هەرچێ وەختە .

قـامكـه گـه‌وره‌ی ورگ زل،
تـــه‌وه‌زه‌ل و تـــه‌پ وفـــل،
ئه‌یوت: ئاشـنـا ناخـوازم؛
لـــه لاوازان جـيــاوازم.





خـه‌نيـنـی ئـه‌هـات شـاده؛
ئـه‌يـوت: بـه‌سـيـه ئيـفـاده؛
تـۆ نـاوت ئـه‌سـپێ كـوژه؛
من نـــاوم دۆشـــاو مـــژه.



نـــاز ده‌كـــا بـــالا بـــه‌رزه:
كێ وه‌ک من جوانو ته‌رزه!؟
خـشـڵ و خـه‌مـڵ و له‌رزانه،
شـيـاوی بـــالا بـــه‌رزانـــه.



بـــراتـــووتـــه - وه‌بـــۆڵـــه-
ئـه‌نـگـوسـتـيـله‌ی لـه كـۆڵه.
ئـێـــژێ: من ده‌وڵـه‌مـه‌ندم؛
ئـيـتـــر وه‌چـی ده‌ربـه‌نـــدم.



تـووتـه‌ی پـۆخـه‌كـه‌ی پووته،
كـورتـــه بـــالايـــه، رووتـــه.
ســـه‌ری ده‌بـــه‌رخـۆی نـاوه.
لـه‌م نـــاوه بـێـــكـه‌س مـاوه.

٣

**ورگ**: زگ، سک؛ **ته‌وه‌زه‌ل**: ته‌مه‌ڵ، له‌ش گران؛ **ته‌پ وفل**: نه‌جووڵ، ته‌مه‌ڵ له رۆيشتن؛ **ناخوازم**: نه‌مگه‌ره‌كه، نامه‌وێ، گه‌ره‌كم نيه.
**لاواز**: لاغر، داڵگۆشت؛ **خه‌نين**: پێكه‌نين، كه‌نين؛ **ئه‌سپێ**: سپێ، سپه؛ **ته‌رز**: له‌بار، رێک وپێک؛ **خشڵ**: زێڕ و زه‌نبه‌ر، زيوه‌ر.
**خه‌مڵ**: رازاندنه‌وه؛ **شياو**: لايق؛ **ئه‌نگوستيله**: كلكه‌وانه، هه‌نگويسک؛ **پۆخه‌كه**: له‌ڕ و لاوان بێ‌فه‌ڕ؛ **پووت**: كورت، خله‌ميتان.





پێنج قامکی سوور لەولاوە،
پاڵیان پێکەوە داوە.
لە پەنای یەک وەک برا،
گشتی قیت راوەستاوە.





بە هەرەوەز کاردەکەن؛
پێکەوە دار باردەکەن؛

**هەرەوەز:** بە گەل کار کردن، زبارە، مەهبەرە.



به هـەر قـامكێ شین دەگەن،
شـەپـەلاغـەی لـێ دەدەن.

**شەپەلاغە**: زیلە، شەقەزلە.

زلەی شین‌یان هاتەبەر؛
چت‌خوارگە ترش و چۆنەر؟
دایانە بەر پێلەقە،
تا لێیان بڕی نەقە.



بالاّبەرزیان لەملاوە،
لەبەریەک ئەکێشاوە.
دوو لە خوار دوو لە سەرێ،
وەختا بوو جیقی دەرێ.



**ترش وچۆنەر**: زل بێ هونەر؛ **وەختابوو**: وەختوو، وەخت بوو.



براتووتە رووت کریا؛
ئەنگوستیلەکەی بریا.
قیلیان دەڕووی هەڵساوی،
هەرمابوو کونی چاوی.



تووتەکەشیان دۆزیەوە؛
وەک تۆپ دەیانقۆزیەوە.
ئەگریا: داڵکە مردم؛
وڵم کەن! من چەکردم؟



**قیل**: قیر؛ **هەڵساوین**: پیا ساوین؛ **قوزتنەوە**: هەلخستنەوە و لە حەواوە گرتنەوە؛ **داڵکە**: دایکە، دایە، ئەیا.
**وڵم کەن**: وێڵم کەن، لیم گەڕێن؛ **چەکردم**: چم کردووە، چەم کردگە.







تـووتـه كه‌فـتـه سـه‌رزه‌وین.
ئه‌مجـار سـووره‌كان ره‌وین.
شیـنه‌كـانی هـاومـالّی،
دلّـیـان سـووزیـا وه‌حـالّی.

**ره‌وین**: بلاّوه‌یان كرد.



وتیان : ئێمەی خۆپەسەن،
خوەمان خوەمان کردەپەن.
هەتا وا لێک بڵاوبین،
ئەشێ سەربێکڵاو بین.



لەمەولا یەکتر دەگرین؛
ئازا دەژین تا نەمرین.
کۆڕێکیان بەست وەک برا؛
پەیمانی یەکبوون درا.



**کۆڕبەستن**: کوبوونەوە، یەکگرتن.

سووره ڕەچاویان کردن؛
زوو شاڵاویان بۆبردن.
شینەکان وەکینەوە،
پێشیان لێ بڕینەوە.
دەسکرا بە گەف کردن،
دەگەڵ خۆ بە سەف کردن.





**ڕەچاوکردن**: کردنە چاو؛ **شاڵاو بردن**: پەلاماردان، حەملە کردن؛ **پێش لێ برینەوە**: بەرگرتن؛
**گەف کردن**: ترساندن، هەڕەشە.



شین خۆیان خڕ کردەوە؛
ناولەپیان پڕکردەوە.
سازیان کرد مستەکۆڵە؛
بۆ ئەستاندی تۆڵە.

**خڕکردنەوە**: جەمەوکردن؛ **ناولەپ**: ناو مشت؛ **مست**: مشت؛ **تۆڵە ئەستاندن**: حەق سەندنەوە.



هەروا سوورەو رادەكا؛
تۆزو خۆڵ بە با دەكا.

نەیانزانی پێنج ئەنگوست
یەكتر بگرن دەبنە مست.
دەمی زۆردار دەشكێنن؛
تۆڵەی خۆیان دەستێنن.

ISBN 964-92150-3-4
9 789649 215037

۵۰۰ تمەن

پینج ئەنگوست دەبنە یەک مست / شیعر عبدالرحمن شرفکندی (هەژار)
نەخش و نیگار بهزاد تارا. ـ تهران: تازه نگاه، ۱۳۸۰.
۱۲ ص.: مصوّر (رنگی).

ISBN 964-92150-3-4

فهرستنویسی براساس اطلاعات فیپا.
گروه سنی: ب.
۱- شعر کردی ۱ فا / ۸
الف. شرفکندی، عبدالرحمن. ب. تارا، بهزاد، تصویرگر.
کتابخانه ملی ایران ۹۰۷۱ - ۸۰م

ویرایش (ادیت): ماجد مردوخ روحانی
کامپیوتر: مرکز گرافیک (حمیدرضا زرّی)
چاپ دوم: تابستان ۱۳۸۰ (۲۰۰۱)
تیراژ: ۶۰۰۰ نسخه
انتشارات تازه نگاه

Tazenegahpress@Hotmail.Com

انتشارات تازه نگاه

